


7- لەڕووی تقادم: ڕهن تامینی کۆتایی پێدێت بە تقادم لەکاتێکدا عقاری مرهون دەگوازرێتەوە بۆ حائز وە دائن مرتهن بێ دەنگ دەبێ لەبەرزکردنەوەی دعوی الرهن لەسەر حائز بەبێ بوونی عوزر لەماوەی(15 ساڵ) لەکاتی هاتنی ماوەی قەرزەکە، لەڕهن حیازی تقادم نییە چونکە لە أصلدا ماڵی مرهون لە حیازەی ڕاهن دێتەدەرەوە.

8- لەڕووی ولایە : لە تامینی وەکو قاعدە ئەگەر باوك ماڵی صغیری رهن کردن بۆ قەرزێك بۆخودی خۆی وەماڵەکە توشی هلاك بوو ئەوا باوکەکە زامن نابێ، لەحیازی ئەگەر باوك مالی صغیری ڕەهن کردن بۆ قەرزێك بۆ خودی خۆی وە ماڵەکە توشی هلاك بوو ئەوا باوکەکە زامن نابێ تەنها بەقدر قەرزەکەی خۆی نەبێ.

((إنشاء الرهن الحيازي))

رهن حیازی دروست دەبێ بەگرێبەستێکی عینی ئەگەر محلەکەی منقول بێ، وە دروست دەبێ بە گرێبەستێکی عینی شکلی ئەگەر محلەکەی عقار بێ.

- أركان عقد الرهن الحيازي:-

1- رضا ((ڕەزامەندی مرتهن و راهن))

2- محل ((منقول و عقار))

3- سبب((قەرزی زامن کراو))

4- حيازة ((وەرگرتن))

حيازة المال المرهون :-

رهن حیازی گرێبەستێکە کەوا دروست نابێ تەنها بە وەرگرتن((قبج)) نەبێ کە بریتی یە لە گرێبەستێکی عینی کەوا وەرگرتن رکنە تێیدا.

ئامانج لە گواستنەوەی حیازە ئەوە نییە کە مرتهن بتوانێ ماڵی مرهون حبس بکات بەڵکو بۆ ئاگادارکردنەوەی کەسانی ترە((غیر)) بەوەی کەوا شتە ڕەهن کراوەکان بەشێك بن لە أموالی ڕاهن.

الاصل حیازەی مالی مرهون دەگوازرێتەوە بۆ دائن مرتهن، وە دەکرێ لەلای کەسی سێیەم بێ، کە ناو دەبرێ بە عدل، ئەمەش بۆ هاتنە دی سودەکان وەکو : إعفا کردی دائن مرتهن لە پارێزگاری کردن و بەڕێوەبردن و




استغلال كردن و زيان نەگەياندن بەمالی مرهون لەلايەن ڕاهن مرتهن، هەركەسێك دروستە ببێتە عدل جگە لە ڕاهن .

- پێويستە حيازەی مالی مرهون بگوازرێتەوە بۆ مرتهن يان عدل بە شێوەيەكی ديار و بەڕاشكاوی.
- پێويستە حيازەی دائن مرتهن يان ئەوەی شوێنی دەگرێتەوە بەردەوام بێ تاوەكو كۆتايی هاتنی ڕەهن.
- وە لە گواستنەوەی حيازەی مالی مرهون بۆمرتهن هەمان أحكامی گواستنەوەی حيازەی مبيع بۆ مشتری پەيڕەو دەكرێ ، بۆنموونە : تسليم كردنی مادی شتێكی مادی وەكو : سەعات ، وە ڕەهن كردنی دەين بە تسليم كردنی سندنی قەرزەكە دەبێ، وە تسليم كردنی عقار بە چۆڵ كردنی عقارەكە دەبێ.

.........................................

- إيجار العقار المرهون للراهن : قانون ئيستسنائی كردوە لە بنەمای گواستنەوەی حيازە و مانەوەی لەلايەن مرتهن يان عدل بەكرێ دانی عقاری مرهون بۆ هەمان ڕاهن بە مەرجێك دەبێ بەكرێ دانەكە إعلان بكات بە نوسينی لە سندی رهن لە فەرمانگەی تۆماركردنی خانوبەرە.

.........................................

- بيع الوفاء: إتفاقێك هەيە كە بنيات نراوە لەسەر ئەوەی كەوا لە چ كاتێك بائع ثمني گەڕاندەوە بۆ مشتری ئەوا مشتری مبيعی بۆ بگەڕێنێتەوە ؛ ئەمەيان مشرعی عێراقی بە ڕەهن حيازی داناوە تەنانەت ئەگەر لايەنەكان ناوی لێ بنێن ؛ بيع بەلام ناما نجيان رهن و زەمان كردنی قەرزەكە بێ وە عبرە لە عقود بە مەبەست و ماناكەيەتی نەك بە ألفاز و ڕستەكان. لەم 1333 دەڵێ : بيع الوفا بەڕەهن حيازی دادەنرێ.
- رهن الدين :- دەركرێ قەرز رهن حيازی بكرێ ئەميش لەڕێگای تسليم كردنی سندی قەرزەكە بەمەرجێك دەبێ ئەو قەرزە قابلی حواله و قابلی حجز بێ، بۆنمونە : ناكرێ نفقه ڕەهن بكرێ چونكە قابلی حجز نييە، وە دەكرێ پارە( نقود ) ڕەهن حيازی بكرێ كە ناو دەبرێ بە( رهن الناقص ) .

((آثار الرهن الحيازي))




بالنسبة للمتعاقدين

بالنسبة للغير

آثار الرهن الحيازي فيما بين المتعاقدين :

- بالنسبة للراهن :- ڕاهن خاوەنیەتی مالی مرهونی دەمێنێتەوە، وە ملتزمە بە :

1- گەرەنتی کردنی رهن.

2- گەرەنتی کردنب هلاك یان تلف بوونی مالی مرهون.

3- خەرجییەکانی عقد( مادام اتفاق نەبێ بە پێچەوانەی ئەمە ).

- بالنسبة للدائن المرتهن :-

دووسیفەتی هەیە : دائن مرتهن ، وە دوومافی هەیە :

مافی شخصی( قەرز) و مافی عینی تبعی( رهن )

وەکو دائن: مافی زەمانی عامی هەیە لەسەر هەموو أموالی مدین بـە إعتبـاری دائنێکـی عـادی وە یەکسـانە لەگەڵ باقی دائنەکانی تر.

وە دائن مرتهن ناتوانێ تەنفیز بکات لەسەر أموالی میدین ڕەهن نەکراو تـەنها ئەگـەر بێتـو ئـەو مرهونـە بەشی دانەوەی قەرزەکە نەکات ئەوکاتە باقیەکەی وەردەگرێتەوە وەکو دائن عادی.

وە ئەگەر بێتو ڕاهن غیری مدین بێ ئەوا نابێ تەنفیز بکرێ لەسەر ئەوماڵەی ڕاهن کەوا تخصـیص نـەکراوە بۆ ڕەهن چونکە ڕاهن کفیلێکی عینی یە.

وەکو مرتهن: مافەکەی لەماڵی مرهون هەیە، کەوا زامنی وەرگرتنەوەی قەرزی زامن کـراو دەکـات لـەڕێگای تقدم و تتبع و حبس.

وە دائن مرتهن ملتزمە بە :

1- پارێزگاری کرنی شتە رهن کراوەکە.

2- بەڕێوەبردنی مالی مرهون.

3- استغلال کردنی مالی مرهون.

4- گەڕاندنەوەی مالی مرهون لەکاتی کۆتایی هاتنی ڕەهن.





وەپێویستە لەسەر دائن مرتهن لە تەنفیز کردنی ئیلتزاماتەکەی کۆششی عنایە شخص معتادی هەبێ نەك عنایە شخصی بۆ موڵکەکانی، وە پێچەوانەی ئەمە بەرپرسیار دەبێ چونکە التزاماتەکەی پێشێل کردووە.

دائن مرتهن ناتوانێ سود وەرگرێ ( انتفاع ) بە ماڵی مرهون یان بەروبومەکەی وەربگرێ بەبێ بەرامبەر چونکە بە موڵکی ڕاهن دادەنرێ بە پێی م 1340 ق. م. ع.

دائن مرتهن استغلالی ماڵی مرهون دەکات بە سیفەتی نائبی قانونی لەجیاتی ڕاهن پێویستە بۆ ڕاهن حسابێکی تفصیلی تقدیم بکرێ لەجیاتی بەڕێوەبردن و استغلال کردنی مالی مرهون.

وە حکمە لە قەدەغەکردنی سود وەرگرتنی مرتهن بە ماڵی مرهون بەبێ بەرامبەر بریتییە لە :

قەدەغەکردنی وەرگرتنی فوائدی ربوی کەوا قانون قەدەغەی ربای کردووە، بۆیە هەر اتفاقێك بكرێ کە بەهۆیەوە دائن مرتهن بتوانێ سود وەرگرێ لەماڵی مرهون بەبێ بەرامبەر بە باتڵ دادەنرێ.

...........................................

المقاصة بين غلة المرهون والدين المضمون :-

مرتهن استغلالی مالی مرهون دەکات بۆ حسابی ڕاهن نەك بۆ حسابی تایبەتی خۆی، ئەو بەروبومەی دروست دەبێ لەئەنجامی مالی مرهون دەبێتە موڵکی ڕاهن.

بەڵام مرتهن ملتزم نییە بە دانی بەروبومەکە بەڕاهن بەڵکو دەبێتە مدین دەبێ قیمەتەکەی بداتەوە، وە هەروەها لە مرتهن سیفەتی دائن مرهون (( مدین بەو بەهایەی کە سوودی وەرگرتووە لەمالی مرهون )).

غلە ( بەروبوم ):- بریتی یە لە صافی بەهاکەی دوای دانی ئەو مصروفاتەی کە خەرج کراوە بۆ بەدەستهێنانی ئەو بەروبومە.

وە مقاصە دەکرێ لەنێوان دوو قەرز:

کەوا بەروبومی مالی مرهون وەردەگرێ لەجیاتی قەرزی زامن کراو.

T.B : مشرعی عێراقی دەرچووە لە و قاعدەی کە دەڵێ:

مقاصە تەنها لە نێوان دوو قەرزی مستحق الاداء دەکرێ.

آثار الرهن الحيازي بالنسبة للغير :-

- مەرجەکانی جێبەجێ بوونی رهن حیازی لە مافی کەسانی تر( غیر ) : ئەگەر منقول بێ : مەرجە عقدی رهن بنوسرێ لە ورقەیەکی سابتە التاريخ لەگەڵ تخصیص کردنی رهن.

- ئەگەر عقاریبێ: مەرجە تۆمار بکرێ لە فەرمانگەی تۆمارکردنی خانوبەرە لەگەڵ تەخصیص کردنی ڕەهن.
- وە تاریخی تۆمارکردن یان نوسین مرتبەی ئەو ڕەهنەکە دیاری دەکات پێویستمان بەتاریخ سابت هەیە بۆ دانی أولویە بەیەکێك لە دائنەکان لە کاتی دروست بونی تزاحم .

..........................................

أولا :- حق الحبس :-

ڕەهن حیازی بە مرتهن دەبەخشێ ئەو دەسەڵاتەی بەسەر شتە ڕەهن کراوەکە کە وا دەتوانێ حبسی بکات لەلایەن هەموو خەڵك تاوەکو قەرزەکەی وەربگرێتەوە لەگەڵ فوائد و تەواوی مصروفاتەکان.
حبسی شتەکە دەکات لەڕاهن (( جا چ مدین بێ یان کفیل عینی بێ )) وە لە غیر (( وەکو : کڕیاری عقاری مرهون دوای تۆمارکردنی ڕەهنەکە )) وە هەروەها لەبەرامبەر غیر لە دائنەکانی دوای خۆی لە مرتبە .
بەڵام مرتهن ناتوانێ شتەکە حبس بکات بۆ گەرەنتی کردنی قەرزێکی تر تەنها دەتوانێ حبسی بکات بۆ گەرەنتی کردنی قەرزی زامن کراو ئەمەش بەپێی مبدأ تخصیص الرهن.
پ/ ئایا مرتهن دەتوانێ تمسك بکات بە مافی حبس کردنی مالی مرهون لەبەرامبەر ئەو کەسەی لە مزاد بۆی دەرچووە(( الراسي علیه المزاد )) لەحاڵەتی تەنفیز جبری لەسەر ماڵی مرهون ؟

1- ئەگەر بێتو مرتهن بریتی بێ لەو کەسەی کە تەنفیز ئەنجام دەدات لەسەر ماڵی مرهون ئەوا مافی نییە حبسی بکات لەبەرامبەر ئەو کەسەی لە مزاد بۆی دەرچووە تەنانەت ئەگەر بێتو ئەو نرخەی مزادی لەسەر جێگیر بووە کافی نەبێ بۆ دانەوەی قەرزەکە.

2- ئەگەر بێتوو ئەو کەسەی ئیجراناتی تەنفیزی ئەنجامداوە دائینیکی تربێ جگە لە مرتهن : لێرەدا فرۆشتنی مالی مرهون بە مزادی علنی بە فرۆشتنی زۆرە ملێ ئەنجامدراوە و ڕەهنەکە کۆتایی پێدێت بە پێی قانون تەنانەت ئەگەر داواکاری فرۆشتن دائنیکی تربێ جگە لە مرتهن، وە دواتریش مافی حبس کۆتایی پێدێت و مرتهن ملتزمە بە تسلیم کردنی مالی مرهون بۆ ئەو کەسەی کە لەمزاد بۆی دەرچووە بۆ وەرگرتنەوەی مافەکەی لەنرخی ماڵەکە بەپێی مرتبەی ڕەهنەکە.

T.B : دەرچوونی منقولی رهن کراو بەدزی یان بە زەوتکردن لە حیازەی دائن مرتهن یان عدل جۆێکە لەدزی کردن کەناودەبرێ بە : سرقە الضمان.




بۆیە مرتهن مافی هەیە منقولی وەرگریتەوە تەنانەت لە حائزی حسن نیە لەماوەی (3سال) لە تاریخی سرقە الرهن ئەمەش وەکو استثناء لە قاعدەی حیازە المنقول.

ثانیا :- حق التقدم :-

هەمان أحکامی ڕەهن تامینی جێبەجێ دەکرێ لەگەڵ تێبینی کردنی ئەوەی کەوا ناتوانرێ عقاری مرهون ئازاد بکرێ لەڕەهن حیازی تەنها ئەگەر پەیوەست بێ بەڕەهن تامینی.

لەڕەهن حیازی تەتبیقاتی کەمە چونکە مرهون تسلیم دائن مرتهن دەکرێ.

- انقضاء الرهن الحيازي نفس حكم انقضاء الرهن التأميني .

بە دوو شێوە کۆتایی پێ دێت :-

1- بصفة أصلي ((بيع بالمزاد العلني، تحرير العقار المرهون اتحاد الذمة، ... هتد))

2- بصفة تبعي ((بەدانەوەی قەرزەکە))

((حقوق الامتياز))

تعريف حق الامتياز :-

م 1361 / 1 :- امتیاز بریتیە لە أولویە لە وەرگرتنەوەی قەرزێکی دیاری کراو بەڕەچاو کردنی هۆکاری ئەو قەرزە.

وەقانون کاتێك بڕیاری امتیاز دەدات بۆ قەرزێکی دیاریکراو ڕەچاو سیفەتی ئەو قەرزە دەکات بەبێ اعتبارکردنی کەسی دائن بۆیە دەڵێین : دەین ممتاز ، ناڵێین : دائن ممتاز.

خصائص حق الامتیاز :-

1- مافێکی عینی یە

2- مافێکی تبعی یە

3- مافێکە قابلی پارچە پارچە کردنی نیە (الاصل)

4- مافێکە لەسەر هەمو أموالێك هاتووە

5- بڕیار نادرێ تەنها بە پێی دەقێك لەقانون نەبێ.




- **أنواع حقوق الامتياز : -**

1- **الامتياز العام :- لەسەر هەموو أموالی مدین هاتووە( وەکو إمتیازی نفقە ) : - تەنها مافی أولویەی تێدایە واتە مافی تتبعی تێدانییە.**

2- **الامتياز الخاص المنقولي :- لەسەر منقولێکی دیاری کراو هاتووە وەکو (( إمتیازی بائع منقول )) تەنها مافی أولویە تێدایە چونکە مافی تتبع لەکاردەکەوێ بە هۆی جێبەجێکردنی قاعدەی :**

(حيازة المنقول سند الملكية )

3- الامتياز الخاص العقاري :- **لەسەرعقارێکی دیاریکراو هاتوووە وەکو (( إمتیاز بائع عقاری )) مافی أولویە و تتبعی تێدایە وەکو(( رهن تأمینی )).**

التميز بين حق الامتياز وحق الرهن(( الحيازي والتأميني )) :

- **لایەنە پێك چووەکانی حق الامتیاز ورهن الحیازی / التأمینی :-**

1- **لە ڕۆژی درووست بوون : إ متیاز دروست دەکرێ بە دەقێکی قانون، تامینی و حیازی دروست دەکرێت بە اتفاق.**

2- **لە ڕووی محل : امتیاز لەسەر : هەموو أموالی مدین لە منقول و عقار( إمتیاز عام ) یان لەسەر عقارێکی دیاری کراو(( إمتیاز خاص عقاری )) یان لەسەر منقولێکی دیاریکراو(( إمتیاز خاص منقولی ))**

**تامینی : تەنها لەسەر عقارێکی دیاری کراو هاتووە.**

**حیازی: لەسەر عقار یان منقولێکی دیاریکراو هاتووە.**

3- **لەڕووی ترتیبی دائنەکان :-**

**أولویە لە إمتیاز :- بە پێی سیفەتی قەرزەکە دەبێ نەك بە پێی اسبقیە لەقەرز، بە استثنائي إمتیاز عقاری خاص کەوا أولویە تیایدا بە پێی أسبقیە یە لە تۆمار کردن.**

**تامینی : حیازی: أولویە بۆ أسبقە لە تۆمارکردن(( یان بۆ أسبق لە تاریخ سابت ئەگەر منقول بێ ))**




4- لەڕووی شوێنەوار:- لە إمتیاز عام و إمتیاز خاص منقولی : تەنها مافی أولویە دەدرێتە دانێ چونکە مافی تتبع تێیدا لەکاردەکەوێ بەهۆی جێ بەجێکردنی .

قاعدەی : حیازه المنقول سند الملکیه .

لە تامینی / حیازی :- دانێ مافی أولویە و تتبعی هەیە.

5- لەڕووی پێویستی بە ئاگاداری و إعلان کردن:- لە إمتیاز عام و إمتیاز خاص منقولی پێویست بە إعلان کردن ناکات،

لە تامینی/ حیازی عقاری: پێویستە اعلان بکرێ بە تۆمارکردن( تسجیل في طابو)

((نشوء حق الأمتیاز))

الأصل : مافی امتیاز دروست دەبێ بە مجرد جێگیر بوونی ئەو قەرزەی کە قانون إمتیازی پێ داوە بەبێ پێویستی بە إجرائێکی تر، بە استثنائي إمتیاز خاص عقاری: کەوا جێگیر نابێ و جێبەجێ نابێ لەسەر غیر تەنها ئەگەر بێتوو تۆمارکرا لەفەرمانگەی تۆمارکردنی خانوبەرە کەوا وەکو ڕەهنی لێ دێ کە دەکرێ لەسەر عقار(( تامینی یان حیازی )) .

مافی إمتیاز و مرتبەکەی تۆمار دەکرێ بە پشت بەستن بە دەقێکی قانون لەسەر ئەوەی کە دەبێ دروست بوونی دەین ممتاز معزز و بەهێز بکرێ بە حوکمی قەزائی (( وەکو نەفەقەی ئافرەت لە سەرپیاو بەحکم قەزائی )) یان بە سندی رسمی یان بە إعتراف کردنی لایەنەکان بە پێی مادە( (2/74 ) قانون تسجیل عقاری.

..........................................

- آثار حق الأمتیاز:-

- وەکو قاعدە لەمادە( (1362 ) ق.م. ع هاتووە :

1- مەرتەبەی هەر إمتیازێك قانون دیاری دەکات، وەئەگەر بەصەراحەت دەقێك نەبێ لەسەر دەین ممتاز لەسەر مرتبەی إمتیازەکەی ئەوا ئەو قەرزەی کۆتایی لە مرتبە لە جیاتی هەر إمتیازێکە کە قانون دەقی هێناوە لەسەر مرتبەکەی.

2- وە ئەگەر چەند قەرزێکی ممتاز هەبێ لە یەك مرتبە دابن ئەوا قەرزەکە وەردەگرنەوە بەڕێژەی بەهای هەریەکە لە قەرزەکان مادام نص نەبێ بە پێچەوانەی ئەمە.

إنققضاء حق الأمتياز :-

مافى إمتياز وەكو مافى رهن مافێكە تابعى قەرزى زامن كراوە، بۆيە ئەو مافە كۆتايى پێ دێت:

1- بەرێگاى تبعى: بە كۆتايى هاتنى قەرزى ممتاز.

2- بەرێگاى أصلى: ياخود بەسەربەخۆيى لەقەرزى ممتاز و بەبێ كۆتايى هاتنى قەرزى ممتاز.

(الديون الممتازة)

- مراتب الديون الممتازة :- م 1368 / لەبەرامبەر ئەو قەرزەى كە قانون إمتياز پێى داوە بە دەقێكى تايبەت، ئەو قەرزانەى لەمادە (1369 – 1380 ق.م.ع) هاتوون بە ممتاز دادەنرێن.

- ئەم مراتبانە بۆ لەبەركردنە يەك لەدواى يەك :-

1-المصروفات القضائية.

2-المبالغ المستحقة للخزينة

3-مصروفات حفظ المنقول وإصلاحه

4-الأمتيازات العامة

5-مصروفات الزراعة + و الآلات الزراعية

6-بائع المنقول + المتقاسم في المنقول

ملاحظة / تەنها (1) و (2) و (4) تايبەتە بە منقول و عقار، بەلام (3) و (5) و (6) و (7) تەنها تايبەتە بە منقول.

1-المصروفات القضائية م 1369 :-

ئەو مصروفاتە دەگرێتەوە كەوا خەرج كراوە بۆ بەرژەوەندى داننە هاوبەشەكان لە پاراستنى أموالى مدين و فرۆشتنى و دابەش كردنى، بۆنمونە :- مصروفاتى حجز و بيع بالمزاد العلنى و مصروفاتى دعوى غير مباشره و دعوى بولصيه.

- محل الأمتياز :-

ئەو سەمەنەی کە مزادی پێکراوە لەکاتی فرۆشتنی أموالی مدین ((کەواتا إمتیاز لەسەر منقول هەیە ئەنانەت ئەگەر مالی فرۆشراو عقاربێ)).

وەدەکرێ إمتیازێکی تایبەتر بێ وەکو لە فرۆشتنی شتێکی دیاری کراو یان إمتیازێکی گشتی بێ وەکو فرۆشتنی هەموو أموال مدین.

وە ئەو مصروفاتەی خەرج کراوە لە پاراستنی أموالەکە و فرۆشتنی پێش دەکەوێ بەسەر ئەوەی خەرج کراوە لە نیجراناتی دابەش کردن((توزیع)).

- مبنى الأمتياز ((حكمة إعتبارها ممتازا)) :-

- زەریبەت و رسوم و غیری ئەوانە دەگرێتەوە کەوا رێك دەخرێ بە پێی قانونە تایبەتیەکان.

.....................

- محل الامتیاز :- بریتی یە لە ثمني ئەو أموالەی کە باری قورسە بەو إمتیازە ، وە دەوڵەت مافی تتبعی ئەو ماڵەی هەیە و پێویست ناکرێ تۆمەتبار بکرێ لە فەرمانگەی تۆمارکردنی خانوویەرە ئەگەر پەیوەندی بە عقار هەبێ (إستثناء).

إمتیاز مقرر بقانون خاص :-

حکومەت مافی إمتیازی هەیە لە أموالی فەرمانبەرەکانی ولات لەسەر ئەوەی کە بۆی جێگیر دەبێ لەبەرامبەریاندا لە مبالغی مختلسە یان لە ئەستۆیاندا.

ئەمەش بە پێی ماددەی ((1 و 2)) لە قانون إمتیاز المبالغ المستحقة للخزينة 83/ 1958.

.....................

- مبنى الامتیاز((حکمە إعتبارها ممتازا)) :-

بەرژەوەندی گشتی وادەخوازێ کە قەرزەکانی حکومەت گەرەنتی هەبێ چونکە حکومەت خاوەنی ولایە عامەیە.

3-مصروفات حفظ المنقول وإصلاحه م 1371 / 201 /

ئەو مصروفاتە زەروریە دەگرێتەوە کەوا خەرج کراوە لە پاراستنی چەککردنەوەی منقولەکە، کە ئەگەر ئەو مصروفاتەی لەسەر نەکرابایە ئەو منقولە ئەدەگونجا بۆ بەکارهێنان کەوا بۆی ئامادە کراوە، وەکو : کرێ یان چاکەرەوەی سیارە ( فیتەر ) ، وەخەرجی یەکانی ئالیکی ئاژەڵ.

بەلام مصروفات نافعە( تحسینات ) ( جوانکاریەکان ) ناگرێتەوە، وەکو : دووبارە بۆیاغ کردنەوەی سەیارە.

بۆنمونە :- ئەگەر فیتەر سەیارەیەکی چاککردەوە کەوا لە حیازەی خاوەنەکەی بێ ئەوا فیتەر دەتوانێ سەیارەکە بفرۆشرێ لەسەر خاوەنەکەی بۆدانەوەی پارەی چاککردنەوەکە وە وەرگرتنەوەی ئەو پارەیە لە نرخی سەیارەکە پێش دائنەکانی تر جگە لە دائنەکانی مصروفاتی قەزانی و خزینەی عامە .

وەئەگەر چەند مصروفاتێك هەبوو تزاحم و کۆبوونەوە تیایدا ڕوویدا ئەوا هەندێکیان پێش هەندێکی تریان دەکەون لەسەربنەمای ترتیبی پێچەوانەی تاریخی خەرج کردنی ئەو مصروفاتەی واتە ئەو مصروفاتەی لە کۆتایی خەرج کراوە پێش دەکەوێ بەسەر ئەو مصروفاتەی لەسەرەتادا خەرج کراوە.

علە لەو حوکمە ئەوەیە کەوا ئەگەر خەرج بکرێ و شتەکە توشی هلاك یان تلف بوو ئەوا دائن ناتوانێ بە مصروفاتی سەرەتایی مافەکەی وەربگرێتەوە لە بەرهەمی شتەکە.

وەکو قاعدە :- مرتبەی مصروفاتی پاراستن و چاککردنەوەی منقول بریتی یە لە مرتبەی سێیەم، استثناء : ئەگەر مرتهن حیازی یان مؤجر عقار یان صاحب الفندق توانیان تمسك بکەن بەقاعدەی (( حیاز المنقول )) ئەوا لە بەرامبەریان جێ بەجێ ناکرێ.

- محل الأمتياز :- بریتیە لەو منقولەی کە مصروفاتی لەسەر خەرج کراوە بۆ پاراستن یان چاککردنەوە.

- مبنى الأمتياز :- ((حكمة إعتبارها ممتازا)) :- ئەگەر ئەو مصروفاتە نەکرێ ئەوا منقولەکە توشی هلاك و تلف دەبێ ئەوکاتە ناگونجێ بۆ بەکارهێنان کەوا بۆی ئامادە کراوە، وە دواتریش هەموویان سودی لێ وەردەگرن.

- (4) الامتيازات العامة م 1372 / 1 ، 2/

امتیازات عامە بریتی یە لەمانە :-

أ- ئەو برە پارەیە مستەحەقی بەکرێ گیراوەکانە.

ب- ئەو برە پارەیە مستەحەقە بۆ دابین کردنی خواردن و جل و بەرگ و دەرمان.

ت- بژێوی (نفقة) .

أ- إمتياز المبالغ المستحقة للأجراء :-

حكمة هذا الامتياز :- **بريتيه له إعتباراتى انسانى چونكه ئەم چينه دائنه له بژێویياندا پشت دەبەستن بەو كرێ يە بە تايبەتى ئەو دائنەى كە مركزەكەى ڕێگای پێ نادات بە لێكۆڵینەوە كردن، وە هەروەها ئەو بڕپارەیەی مستحقی ئەو بەكرێ گیراوانەیە كە قانون امتیازی بۆ داناوە، ئە زۆر جار بڕە پارەیەكی كەمە و ئەو لەویەتیان كاریگەری نی لەسەر مافەكانی باقی دائنەكان.**

الأشخاص المضمونة ديونهم بالأمتياز :-

**خزمەتكار و كاتب و كرێكار و هەر بەكرێ گیراوێك كەوا كرێ یان موچە وەردەگرێ وەكو :- خزمەتكار و چێشت لێنەر و دەرگاوان و باخچەوان و شۆفێری سەیارە و خزمەتكاری مزرعە( سەپان ) و شوان و گاوان و كرێكاری كێڵگە و كارگە و شوێنی بازرگانی و كاتب و سكرتێری تایبەت و پەروەردەكاری منداڵ و شیردەری منداڵ و وەكیلی بەكرێ گیراو.**




إمتياز المبالغ المستحقة للعامل:-

**بەپێی م 10 / م لە قانون عمل 151 / 1970 بڕی پارەی كرێكار ممتازە كەدەڵێ: (( بڕی پارەی مستحقی كرێكار دەدرێت بە كرێكار یان ئەوكەسەی شوێنی دەگرێتەوە لە مافەكان بەپێی أحكامی ئەو قانونە، بەرزترین پلەی إمتیازی هەیە لەهەموو أموالی خاوەن كاری قەرزار جا منقول بێ یان عقار بێ، وە ڕاستەوخۆ كرێ یەكەی وەردەگرێتەوە لە پێش هەموو قەرزە ممتازەكانی تر وە لەناویاندا مبالغ مستحقه لخزينه الدوله و نفقات و رسوم قچانیه و مصاریفی پاراستن و چاككردنەوە )).**

**كەواتا لە مرتبەی چوارەم تەنها موزەف قانون مدنی لەسەر جێبەجێدەبێ، كەواتە بەپێی قانون عمل امتیازی عامل لە مرتبەی یەكەم دێ بەپێی قاعدەی :الخاص بقيد العام.**

- **كەواتا قانون عمل امتیازێكی گشتی داناوە بە عامل بەشێوەیەكی بەهێزتر لەوەی كە لەقانون مدینی هاتووە لەسێ لایەن بەهێزترە ، إمتیاز عامل:**

1- **بەپێی قانون مدنی لە مرتبەی چوارەمەوە.**

**بەپێی قانون عمل لە مرتبەی یەكەم دێت.**




2- بەپێی قانون مدنی تەنها کرێی عامل دەگرێتەوە وە بەپێی قانون عمل هەموو أموالی مستحقی عامل دەگرێتەوە وەکو : مکافأة ، تعویض .

3- بەپێی قانون مدنی ئەو برە پارەمستحقە دەگرێتەوە لە ((6)) مانگی کۆتایی وە بەپێی قانون عمل هەموو ئەو مستحقی عاملە دەگرێتەوە واتە ماوە دیاری نەکراوە.

ب- إمتیاز المبالغ المستحقة عن توريد المأكل والملبس والدواء :-

حكمة هذا الأمتياز :- بریتیە لە اعتباراتی انسانی کەوا دەخوازێ کە دەبێ موردین ((صیدلیە، سوپر مارکێت ... هتد)) متمانەیان هەبێ بە قەرزار تاوەکو پێداویستیەکانی ژیان بەدەست بێنێ وەکو : خواردن و جل و بەرگ و دەرمان.

بەلام ئەو شتانەی تر کە بازرگان دابینی دەکات وەکو : موادی پێویستی خوێندن لە کتاب و ئەوراق کەوا سەمەنەکەی بەدەین ممتاز دانانرێ .

B T: / لە مەلزەمەکەی مامۆستا هیوا ئەم لاپەرانە ((Slide)) تەنها بۆ زانیارییە ((للمعلومات فقط))

((27 ، 29 ، 34 ، 38 ، 39 ، 42 ، 43، 69 ، 70 ، 71، 72، 83، 84))

جـ / امتیاز النفقة :-

حكمة هذا الأمتياز :- اعتباراتی انسانی وا دەخوازێ کە بری پارەی نەفەقە زەمانی دانی هەبێ بە هۆی پێداویستی دائن لە کاتی بژێوی ژیانیدا.

قەرزی نەفەقە قەرزێکی ممتازە وە هەروەها قەرزێکە قابلی حجز کرن نییە بەپێی م 384 / 4 لەقانون مرافعات.

-محل الأمتيازات العامة :- امتیازاتی گشتی لەسەر هەموو ئەموالی مدین دەکرێ جاچ منقول بێ یان عقاربێ وە پێویست ناکات اعلان بکرێ و تۆماربکرێ لەسجلی عقاری ئەگەر پەیوەست بوو بە عقار. وە مافی أولویە دەداتە خاوەنەکەی.

- (الديون المشمولة بالأمتياز هي) :- امتیاز (6) مانگی کۆتایی دەگرێتەوە واتە قەرزی (6) مانگی پێش تەنفیز کردن، یاخود لە تاریخی ئەو ڕووداوەی کە بەهۆیەوە أموالی مدین تەصفیە کراوە وەکو : مردن و اعسار و إعلان کردنی افلاس.

کەواتە قەرزی (6) مانگی کۆتایی بە ممتاز دادەنرێ وە زیاتر لەو ماوەیە بە قەرزێکی عادی دادەنرێ.

امتیازاتی گشتی یەك مرتبەی هەیە كە بریتیە لە مرتبەی چوارەم، وە لە حاڵـەتی تـزاحم و كۆبوونـەوەی امتیازاتی گشتی، وەكو : كۆبوونەوەی سكرتێر لەسەر ڕاتبەكەی لەگـەڵ ئـەو بازرگانـەی كـە خـۆراكی پـێ فرۆشتووە لەگەڵ خزمێكی نزیكی كە داوای نفقە بكات، هەریەكە لەو قەرزانە یەكسـانن لـە مرتبـەدا لـەو كاتەدا هەریەكە لە قەرزەكان وەردەگرێتەوە بە نسبە و تناسب.

5-مصروفات الزراعه في الآلات الزراعيه م 1273 / 1، 2 ، 3/

أ- إمتياز مصروفات الزراعة :-

حكمة الأمتياز :- بیرۆكەی دادپەروەری بە إعتباری ئەوە كەوا دائن بەماڵی خۆی یان كاری خۆی بەشداری دەكات لەبەرهەم هێنانی بەروبوم، بۆیە دادپەروەری تێدایە بەوەی كە مافەكەی وەرگرێتـەوە لـە سـەمەنی بەروبومەكە لە پێش دائنەكانی تر، وە هەروەها مشرع ڕەچاوی زراعەی كردووە.

المبالغ المضمونة بالأمتياز :- هەر مەبلغێك كە خەرج كراوە بۆ استغلال كردنی زەوی زراعی وە ئەو مبلغـە بریتی یە لە تۆ و كیمیاوی و موادەكانی تر و سەمەنی موادی مقاومە حشرات، یـاخود كرێـی ئـەو كەسـانەی چاندیتیان یان ئەو كەسانەی كە بەكاردەهێنرێن لەكارەكانی زراعە، وە كرێ ی مواشی و آلاتەی كـە بـەكرێ گیراوە بۆ زراعەتی ئەو زەوییە وە ئەو خەرجییە پێویستە بۆ ئاوەدانی زەویەكە، وە سەمەنی ئالاتی زراعـی و خەرجییەكانی چاككردنەوە زەمانی نییە.

محل الأمتياز :- امتیاز لەسەر ئەو بەروبومە دەكرێ كەوا ئەو مبلغەی بۆ بەهەرم هێنانی خەرجكراوە بـەڵام لەسەر خودی زەوییەكە یان ئالاتی زراعی یان مواشی امتیاز نیە كە موڵكی ئەو كەسەیە.

ئەو دائنەی كە تمسك دەكات بە امتیاز پێویستە بسەلمێنێ كەوا قەرزەكەی بەكارهاتووە لەبەرهـەم هێنـانی ئەو بەروبومەی كەوا لەسەری داوای امتیاز دەكرێ.

ب- امتياز المبالغ المستحقة في مقابل الآت الزراعة :-

مەبەست لە ئالاتی زراعی :- هەموو ئەو ئامێرانەیە كە بەكاردەهێنرێ لەكشتوكاڵكردن جـاچ بـەكاربێ بـۆ ئامادەكردنی زەویەكە بۆ زراعە یان لەبەرهەم هێنانی ئەو بەروبومە وەكو : ئامێری ئاودان و چاندن، امتیاز لە سەر هەر مبلغێكە كە خەرج دەكرێ لەسەر ئامێری زراعی وەكو : نرخی ئامێرەكە و كرێی گواسـتنەوەی بـۆ كێلگە و مصروفاتی جوانكاری، مصروفاتی بەڕێوەبردنی ئامێرەكە وەكو: نرخی سـوتەمەنی و كرێـی شـۆفێر زامن ناكرێ بە امتیازی ئالاتی زراعی بەڵكو امتیازی مصروفاتی زراعی زامنی دەكات.

7-مؤجر العقار + صاحب الفندق

أ- إمتياز مؤجر العقار : م 1374 / 1 ، 2 ، 3 ،4 /

- حكمة هذا الأمتياز :-

**مشرع ويستويەتی عقدی ایجار ئاسان بکات، بۆیە ئەو عقدە گرنگی یەکی زۆری هەیە لەژیانی ئابوری و کۆمەلایەتی، ئەگەر ئەو امتیازە نەبێ ئەو زۆربەی خاوەن عقارەکان توشی تردد دەبن لەبەکرێ دانی عقارەکانیان تەنها ئەگەر بێتو مستاجر ئامادە باشی هەبێ کەکرێیەکە پێشەکی بدات یان کفیل یان هەر تامینێکی تر تقدیم بکات وەکو زەمانێك بۆ دانی کرێیەکە.**

- أساس إمتياز مؤجر العقار :- **إمتیازی مونەجر عەقار بریتیە لە بیرۆکەی رهن زەمەنی لەسەر إعتباری ئەوەی کەوا مونەجر و موستەئجر بەشێوەیەکی زەمەنی مەبەستیان ئەوەبووە کە ئەو منقولاتەی موستەئجر لە ناو عقارەکە دادەنێ وەکو زەمانێکە بۆ وەفا کردن بە ئیلتزاماتەکان بەگوێرەی عقدی ایجار.**

- **مەرجەکانی جێگیر بوونی إمتیازی مؤجر :-**

1- **دەبێ عقدی ایجار صحیح بێ.**

2- **دەبێ مأجور عقار بێ.**

- المبالغ المضمونة بالآمتياز :- **ئەو کرێ و مبالغەی کە مستحقی مونەجرە بە گوێرەی عقدی إیجار وەکو : تعویزاتی مستحقی مونەجر لە جیاتی تلف بونی عقارە بەکرێ دراوەکە، یان بەکارهێنانی لە غیری ئەوەی بۆی ئامادە کراوە.**

- محل الأمتياز :- **إمتیازی مونەجر عقار لەسەر ئەو شتانەی کە موجودە لە ناو عقارە بەکرێ دراوەکە کەوا موڵکی مستأجرە جاچ منقول بێ کە قابلی حجزکردن بێ وە بەروبومی زراعی.**

- **مەرجەکانی ئەو منقولاتەی کە إمتیازی لەسەرە :-**

1- **دەبێ ئەو منقولاتە موجود بێ لەناو عقارە بەکرێ دراوەکە وەکو :** ((أثاث ، تحف، **کەلوپەل،** مكائن ،سيارة ، **ئاژەڵ**))

2- دەبێ ئەو منقولاتە قابلی حجز کردن بێت، امتیاز ئەو موادە ناگرێتەوە کە پێویستە بۆ بژێوی ژیانی مستأجر و ئەوانەی نەفەقەی لەسەریانە وەکو: کتابی پێویست بۆپیشەکەی وە ئامێرەکانی کارکردن کەوا بەخۆی وەکەسانی تر بەکاری دەهێنن.

3- دەبێ منقولاتەکە موڵکی مستأجر بێ، وەکو استثناء: إمتیاز دەکرێ لەسەر منقولاتی غیری موڵکی مستأجر وەکو ئەو منقولاتەی موڵکی ئەمانەیە:

أ- مستأجر من الباگن ئەگەر ا یجار من الباگن قەدەغە کرابوو.

ب- موڵکی کەسێکی تر( غیر ) بێ ئەگەر موئەجر لەکاتی دانانی ئەو منقولاتە لەعقارە بەکرێ دراوەکە نەزانێ کەوا موڵکی غیر حسن النیە یە.

جـ- موڵکی خێزانی مستأجر بێ(( مشرعی مصری بە صراحە دەقی لەسەر هێناوە بەڵام مشرعی عێراقی دەقی لەسەر نەهێناوە بەڵام حوکمی منقولاتی موڵکی غیر لەسەری جێبەجێ دەکرێ ئەگەر موئەجر نەزانێ بەوەی کە موڵکی خێزانی مستأجرە))

تێبینی :- لاپەڕە (( 52 تا 88 )) تێدا نییە.

تەواو کەری حقوق امتیاز لەلا (( 52 تا 88 ))

ب-إمتياز صاحب الفندق :-

م 1/1375، 2، 3، 4/

خاوەنی فندق جگە لەوەی کە امتیازی هەیە لەسەر کەلوپەلەکانی ئەو کەسەی دێتە ناو فندق، سێ إمتیازی تری هەیە :-

1- امتیازی موئەجر عقار بە نسبەت کرێی ئەو ژوورەی کە هیچ کەلوپەلێکی تێدانیە.

2- امتیازی دابین کاری خۆراك بە نسبەت ئەو خۆراکەی کە پێش کەشی ئەو کەسە دەکرێ کە دێتە ناو فندق.

3- امتیازی پاراستن و چاککردنەوەی منقول بەنسبەت ئەو ئالیکەی کەوا دەدرێتە ئەو ئاژەڵەی کە لەگەڵ ئەو کەسەیە کە دێتە ناو فندق.

- حكمة الأمتياز :- گەرەنتی کردنی دانی ئەو مبلغەی کە مستحقە بۆ خاوەنی فندق لەسەر ئەوکەسەی دێتە ناو فندق بەبۆنەی دانیشتنی لەو فندقە، ئەمەش لەبەر ئەوەی خاوەنی فندق بە حوکمی کارەکەی

ناچار دەبێ پێشوازی بکات لەهەر کەسێك کە داوای مەئوا و شوێنی حەسانەوە دەکات بەبێ ئەوەی ئامرازێکی سقەبێ بۆ ناسینی ئەو کەسە تەنها ئەو کەلوپەلانە دەبینێ کەوا ئەو کەسە دەیهێنێتە ناو فندق.

-أساس امتياز صاحب الفندق :- قانون ئەو کەلوپەلانەی هی ئەو کەسەیە کەوا دێتە ناو فندق بە ڕەهن داناوە بۆ خاوەنی فندق یاخود لەسەر أساسی رهن حیازی لە جۆرێکی تایبەتە.

تێبینی / بۆ خوێندنەوەی مادەکان بگەڕێوە سەر مەلزەمەی مامۆستا هیوا.

- المبالغ المضمونة بالأمتياز :- ئەو بڕە پارەیە دەگرێتەوە کە مستحقی خاوەنی فندقە لەبەرامبەر نووستن و خواردن و خواردنەوە کەوا پێشکەش کراوە بۆ ئەو کەسەی دێتە ناو فندق وەئەوکەسەی دەعوەتی کردووە لەفندق.

- محل الأمتياز :- امتیاز لەسەر ئەو کەلوپەلانەیە کە هی ئەوکەسەیە دێتە ناو فندق یان هی ئەو کەسانەیە کە لەگەڵی دان لەناو فندق یان لە ملحقاتەکانی فندق وەکو : گەراج ، وە جل و بەرگ و سەیارە و ئاژەڵ و پارە و زێڕ و زیو دەگرێتەوە.

- مرتبة امتياز مؤجر العقار وصاحب الفندق :- موئەجر لە امتیاز مرتبەی شەشەمی هەیە، بەلام پێش دەکەوێ بەسەر مصروفاتی پاراستن و چاککردنەوەی منقول وە مصروفاتی زراعی و ئالاتی زراعی ئەگەر بێتو موئەجر عقار حسن النیە بێ.

بۆنمونە : ئەگەر موستەئجر ئامێرێکی زراعی کڕی و سەمەنەکەی نەدا وە بریە ناو ئەو زەویەی کە بەکرێی گرتووە بەبێ ئەوەی کە موئەجر بزانێ سەمەنەکەی نەدراوە بۆیە ئەوکاتە امتیازی موئەجر عقار پێش امتیازی ئالاتی زراعی دەکەوێ.

وەهەروەها خاوەنی فندق لە امتیاز مرتبەی شەشەمی هەیە، ئەگەر امتیازی موئەجر عقار تزاحمی کرد وە کۆبووە لەگەڵ امتیازی خاوەنی فندق ئەوا کامەیان تاریخی لە پێشتر بوو پێش دەکەوێ بەسەر ئەوەی تر.

ئەگەر مستأجر هەندێ کەلوپەلی هێنایە دەرەوە لەخانووە بەکرێ گیراوەکە بەبێ ئەوەی موئەجر پێی بزانێ و بردیە ناو فندق کە خاوەنی فندق نەزانێ بەوەی کە موئەجر امتیازی لەسەر ئەو کەلوپەلانە هەیە ئەوا امتیازی موئەجر نافذ نابێ بە نسبەت خاوەنی فندق تەنانەت ئەگەر تاریخی لە پێشتر بێ، وە هەروەها ئەگەر ئەوکەسە کەلوپەلەکانی بردەدەرەوە لە فندق و لەناو خانوە بەکرێ گیراوەکەی دانا وە موئەجر حسن

**النيه بێ ئەوا امتیازەکەی پێش دەکەوێ چونکە امتیازی خاوەنی فندق کە تاریخی لە پێشترە تەنفیز نابێ لەمافی مونەجر.**

8- بائع المنقول + المتقاسم في المنقول :-

أ- امتياز بائع المنقول : م 1376

- حكمة الامتياز :- **بائع ئەو کەسەیە کە شتەکەی لە موڵکی مشتری یە بۆیە داد پەروەری تێدایە لەوەی کە مافەکەی وەربگرێتەوە پێش داننەکانی تر، جگە لەمە بۆ ئاسانکردنی عقدی بیع کە بناغەی چالاکی ئابوری یە چونکە امتیاز جۆرێك لە متمانە و ئیتمان دەداتە مشتری.**

- شروط ثبوت امتياز بائع المنقول :-

1- **دەبێ عقدێکی بیعی صحیح هەبێ.**

2- **دەبێ مبیع منقول بێ.**

-المبالغ المضمونة بالأمتياز :-

**امتیاز گەرەنتی ثمن و ملحقاتەکانی دەکات وەکو: فوائدی اتفاقی و قانونی، وە گەرەنتی امتیازی تعویضات ناکات کەوا دروست بووە بەگوێرەی عقدی بیع لە ئەستۆی مشتری.**

- محل الامتياز :- **امتیاز هەیە لەسەر شتە فرۆشراوەکە بەمەرجێك لەحیازەی مشتری بمێنێتەوە. وە ئەگەر مبیع لەحیازەی مشتری هاتە دەرەوە ئەوا بائع مافی تتبعی هەیە بەمەرجێك نابێ ئەو کەسەی حیازەی بۆ گواستراوەتەوە حسن النیە بێ.**

**پ/ ئایا حوکمی چی یە ئەگەر منقول گۆڕا بۆ عقار ؟**

**ج/ ئەگەر منقول گۆڕا بۆ عقار بطبیعتە، وەکو ئەگەر ئەو ئەدەواتی فرۆشراوە بەکاربهێنرێ لە بیناکردن ئەوا شتە فرۆشراوەکە سیفەی خودی معقولی لەدەست دەدات و دەگۆڕێت بۆ عقار. بۆیە امتیاز نیە لەسەر عقار.**

**بەلآم ئەگەر منقول گۆڕا بۆ عقار بالتخصیص وەکو : سبلیت کە فرۆشرا و تخصیص کراوە بۆ خزمەت کردنی عقارێکی دیاری کراو ئەوا مافی امتیازی دەمێنێ، چونکە شتە فرۆشراوەکە خودی خۆی لەدەست نادات بە مجرد گۆڕانی بۆ عقار بالتخصیص.**









ئەگەر خاوەنی عقاری مرهون سبلتێکی کڕی و ئەمە ئەکەی ئەداو تخصیصی کرد بۆ خزمەت کردنی عقاری مرهون ئەوا ڕەهنەکە دەیگرێتەوە و پێش دەکەوێ بەسەر إمتیازی بائع منقول ئەگەر بێتو دانن مرتهن حسن النیه بێ.

- مرتبة الأمتياز :- بائع منقول لە امتیاز مرتبەی حەوتەمی هەیە، واتە لەدوای امتیاز مونەجر عقار امتیازی خاوەن فندق دێت، بەڵام پێش ئەو دووانە دەکەوێتەوە ئەگەر اسبات بوو کە مونەجر یان خاوەنی فندق بەمەیان زانیوە لەکاتی دانانی مبیع لە خانوە بەکرێ گیراوەکە یان لەفندق.

- إمتياز المتقاسم في المنقول :- م 1377 / 1، 2 /

- المبالغ المضمونة بالأمتياز :- ئەم ئیمتیازە گەرەنتی مافەکانی هەریەکە لە متقاسمین دەکات لەگەڕانەوە بۆ سەر ئەوانی تر بەهۆی قسمەوە لە وەرگرتنەوەی مافەکەی.

- محل الامتياز :- امتیاز ئەو بەشە جیاکراوەیە کەوا کراوە لە بەشی هەریەکە لە متقاسم.

- مرتبة الامتياز :- ئەم ئیمتیازە هەمان ئیمتیازی بائع المنقولە کەوا مرتبەی حەوتەمە، لەکاتی تزاحمی امتیازی بائع منقول لەگەڵ امتیازی متقاسم فی المنقول ئەوا کامەیان تاریخی لە پێشتر بێ ئەوا پێش دەکەوێ، ئەگەر قسمە لە دوای بیع بێ ئەوا امتیازی بائع پێش دەکەوێ، وە ئەگەر بیع لەدوای قسمە بێ ئەوا امتیازی متقاسم پێش دەکەوێ.

(( الامتيازات الخاصة العقارية ))

بریتیە لە و امتیازاتەی کە لەسەر عقارێکی دیاری کراو دەکرێ لە عقاراتی مدین، کەوا ئەمانەن :-

أ- امتیازی بائع عقار.

ب- إمتیازی مقاول و مهندس و معماری.

ج- امتیازی متقاسم فی العقار.

- مراتب الأمتيازات العقارية الخاصة :- مافەکانی امتیازی تایبەتی عقاری وەکو: رهن تامینی، هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوانیاندا تەنها لەڕووی سەرچاوە نەبێ، وە دیاریکردنی مرتبەی امتیاز بە پێی تاریخی تۆمارکردن دەبێ لەتابۆ ئەوەك بە پێی سروشتی قەرزەکە هەروەکو لە مافەکانی تری امتیاز.

أ- امتياز بائع العقار :- م 1378 / 1 ، 2 /

- محل الامتياز : ئیمتیاز هەیە لەسەر عقارە فرۆشراوەکە.

- مرتبة الأمتياز : بۆ جێگیر بوونی امتیاز پێویستە تۆمار بکرێ لە فەرمانگەی تۆماری خانو بەرە، ئەم ئیمتیازە مرتبەی بۆ دروست دەبێ لەکاتی تۆمار کردن.




الأولوية للسابق في التاريخ التسجيل

مرتبة (1 – 7)

استثناء الحيازة بحسب النية.

.................................................

ب- إمتياز المقاول والمهندس المعماري م 1379 / 1، 2 ، 3/

- حكمة الأمتياز :- ئەم ئیمتیازە تەنها لەسەر زیادەی قیمەتی عقارەکە بەهۆی مقاول و ئەندازیاری بیناسازی، نەوەك لەسەر هەموو قیمەتی عقارەکە.

.................................................

- مرتبة الأمتياز :- بۆ جێگیر بوونی امتیازی مقاول یان ئەندازیاری بیناسازی پێویستە سندێکی رەسمی بنوسرێ دەربارەی ئەو کارانەی ئەو کەسانە کە کردوویانە وە ئەو برە پارەی مستحقە لە بەرامبەر ئەو کارانە وە تۆمارکردنی ئەو امتیازە لە تابۆ لەسەر بنەمای ئەو سەنەدە، وە ئەو امتیازە مرتبەی بۆ دروست دەبێ لەکاتی تۆمارکردن، وە ئەگەر تزاحم روویدا لە نێوان ئەو إمتیازە و هەر مافێکی عینی لەسەر هەمان عقار ئەوا کامەیان تاریخی تۆمارکردنی لە پێشتربێ پێش ئەوانەی تر دەکەوێ.

بەلام ئەگەر ئەو امتیازە دروست بووبێ بەهۆی ئەو کارانەی کراوە لە عقاری مرهون ئەوا جێ بەجێ کردنی ئەو بنەمایەیی پێشوو دائما رهن پێش دەخات بەسەر امتیاز مادام پێویست بێ کە رەهن تۆمار کرابێ پێش دروست بوونی امتیازەکە، بەلام مشرع بریاری داوە کەوا ئیمتیازی مقاول و ئەندازیاری بیناسازی پێش خستووە بەسەر رهن تامینی یان رەهن حیازی عقاری.

- امتياز المتقاسم في العقار :- م 1380 / 1 ، 2/

پێویستە ئەو ئیمتیازە تۆمار کرابێ لە فەرمانگەی تۆماری خانووبەرە، وە مرتبەی بۆ دروست دەبێ لەکاتی تۆمارکردن.

((مراتب الديون المتعلقة بالعقار))

1-امتياز بائع عقار.

2-إمتياز مقاول و مهندس معماري.

3-إمتياز المتقاسم في العقار.

4-رهن تأميني.

5-رهن حيازي / عقاري.

مەرتەبەی ئەو قەرزانەی پەیوەستە بە عقار دیاری دەکرێ بە پێی تاریخی تۆمارکردنیان لە فەرمانگەی تۆماری خانووبەرە، واتە بە پێی اسبقیە فی التاریخ.

ملاحظة /

1- امتیازی مقاول و ئەندازیاری بیناسازی پێش دەکەوێ بەسەر رهن ((تأمینی / حیازی / عقاری)) تەنانەت ئەگەر تۆمارکردنەکەی لە پاش رهنەکە بوو.

2- إمتیازی مبالغ مستحقە للخزینە پێش دەکەوێ ئەگەر پەیوەست بێ بە عقارێک بەهۆی نەبوونی تاریخی تۆمارکردن ((لەبەر ئەوەی پێویست ناکات تۆمار بکرێ لەفەرمانگەی تۆماری خانووبەرە).

